# فێرگەی زمانی کوردی
## (اموزش زبان كوردي)

**نووسینی: عەبدولموتەلیب**

**ئەم بابەتە بڵاوکراوەتەوە لە: ماڵپەڕی کورد و کوردستانی**

**ناونیشانی ماڵپەڕ**

**www.motalleb.blogfa.com**

**بەرواری بڵاوکردنەوەی لە ماڵپەڕ**

**2011 زاینی 1389 هەتاوی**

**گۆڕینی بۆ پەرتوك: نەیثەن**

**بەرواری گۆڕینی بۆ پەرتوکی ئەلیکترۆنی**

**2016**

# ڕێنووسی زمانی کوردی

## ئەلفبێ

ژمارەی پیتەکانی ئەلفبێی کوردی (٣٤) دانەن و بریتین لە:
ئـ - ا - ب - پ - ت - ج - چ - ح - خ - د - ر - ڕ - ز - ژ - س - ش - ع - غ - ف - ڤ - ق - ك - گ - ل - ڵ - م - ن - و - ۆ - وو - هـ - ە - ی - ێ.

## بزوێنەکان

بزوێن بەو دەنگانە دەوترێن کە لە کاتی بێژە (تلفظ)یاندا، دەم و زار تۆزێ زیاتر دەکرێنەوە و زیاتر دەکێشرێن. بزوێنەکان جووڵە و بزواندن دەخەنە ناو وشەوە. بزوێنەکان لەڕاستیدا (٨) دەنگن، بەڵام بە ئەلفبێی سۆرانی (عەرەبی) تەنها (٧) دەنگیان نیگار و پیتیان بۆ دانراوە و دەنووسرێن و بریتین لە:

**(ا - و - ۆ - وو - ە - ی - ێ).**

**یاسا:** (هەر وشەیەکی کوردی لانی کەم یەك بزوێنی تێدا بەکار دەچێت.):

(ناو naw) - (کورد Kurd) - (کۆمار komar) -
(سوور sûr) - (بەرد berd) - (کوردی kurdî) -
(سێ sê) - (زانستپەروەر zanistperwer).

# بزرۆکە (i)

هەندێ وشەی کوردی هەن کە لە ڕواڵەتدا بزوێنیان تێدا نابینرێ وەکوو: (بردن، من، ژن، چل، مردن، بزن، خستن)، بەڵام لەڕاستیدا دەنگی بزوێنیان تێدایە. ئەو بزوێنە لە ئەلفبێی کوردیی لاتینیدا بە پیتی (i) دیاری کراوە، بەڵام لە ئەلفبێی عەرەبیدا هیچ پیتێکی بۆ دانەنراوە، دیار نییە و بزر بووە، بۆیە ناوی نراوە: (**بزرۆکە**). نموونە:

(بردن birdin)، (من min)، (ژن jin)، (چل çil)،
(مردن mirdin)، (بزن bizin) و (خستن xistin).

وشەی "مشك" لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا بە دوو شێوازی (mişk) و (mişik) بێژە دەکرێت، بەڵام لە ئەلفبێی عەرەبیدا هەر بە یەك شێواز دەنووسرێت: "مشك".

کەوا بێت (٨)ەمین دەنگی بزوێنی کوردی بە ئەلفبێی عەرەبی نانووسرێت و، "بزرۆکە"یە. (i).

# ئەلفبێی کوردی بە لاتینی

لاتان سەیر نەبێ ئەگەر بڵێین بۆ ئەوەی لە ئەلفبێی کوردی کە بە پیتی عەرەبی دەنووسرێ، باشتر تێ بگەن، زۆر گرنگە **ئەلفبێی کوردیی لاتینی** بناسن. ئەم ئەلفبێیە بریتییە لە:

A - B - C - Ç - D - E - Ê - F - G - H - I - Î - J - K - L - M - N - O - P - Q - R - S - Ş - T - U - Û - V - W - X - Y - Z.

بزوێنەکانی بریتین لە (٨) دەنگ و هەر هەشتەکەیان دەنووسرێنەوە: (**A - E - Ê - I - Î - O - U - Û**).

**پاشکۆ**: لە ناوەڕاست و کۆتاییی وشەدا: (ڕ = **rr**) و (ڵ = **ll**).

(پەڕۆ = perro)، (کەڕ = kerr) یان (کەڵك = kellk)، (ساڵ = sall).

پێویست ناکات لە سەرەتای وشە بە ئەلفبێی لاتینی، بۆ نووسینی (ڕ) کەڵك لە (rr) وەرگرین، چونکوو زۆر ناشیرین دێتە پێش چاو، بۆیە هەر (r) بەسە. وەکوو: (ڕاز = raz)، (ڕێگا = rêga)، (ڕۆژ = roj). بەڵام زۆر گرنگە لە سۆرانیدا هەموو پیتێکی سەرەتای وشە کە بە (ر) دەست پێ دەکات بە (ڕ) بنووسرێن. نموونە: ڕێز، ڕەش، ڕزگار.

# پیتەیارمەتیدەر

**یاسا**: (لە زمانی کوردیدا دوو بزوێن بەدوای یەکتردا نانووسرێن.):
بۆ نموونە، (یار) بە لاتینی وا نانووسرێت: (îar) یان (iar).
هەروەها (وان) وا نانووسرێت: (uan) یان (ûan) یان (oan).

بۆ ئەوەی دوو بزوێنەکە بەدوای یەکتردا نەنووسین، کەڵك لە پیتێکی نەبزوێن وەردەگرین کە یارمەتی دەدات دوو بزوێن پێکەوە نەنووسرێن. بەو پیتانە دەوترێن: "**پیتەیارمەتیدەر**"، کە بریتین لە (**ی y**) و (**و w**). بەمجۆرە نموونەکانی سەرەوە ئاوا دەنووسرێن:
(یار yar).
(وان Wan).

(**پیتەیارمەتیدەر**) لە ئەلفبێی لاتینیدا بە پیتی (**y**) و (**w**) دیاری کراون. لە ئەلفبێی عەرەبیدا (**ی**) و (**و**)یان بۆ بەکار دەچێت: (**ی y**)، (**و w**)، هەر چەند بۆ بزوێنەکانی (î و u)ش بەکار دەچن

# هەم بزوێن و هەم نەبزوێن

لە ئەلفبێی عەرەبیدا پیتێکی تایبەت نییە کە "پیتەیارمەتیدەر"ەکانی (**y**) و (**w**)یان پێ بنووسرێتەوە. بۆ ئەو مەبەستە هەر کەڵك لە پیتەکانی (**ی**) و (**و**) وەردەگیرێ کە بۆ بزوێنەکانی (**î**) و (**u**)ش بەکار دەچن، واتە (**ی**) و (**و**) هەم بزوێنن و هەمیش نەبزوێن:

(**ی y**)، (**و w**)، (**ی î**)، (**و u**).

بزوێن: (ی î)، (سلێمانی Silêmanî). (تیر =tîr).
نەبزوێن: (ی y)، (کەی key). (بەیت = beyt).

بزوێن: (و u)، (کول kul).
نەبزوێن: (و w)، (خەوتن xewtin).

جیاکردنەوەی بزوێن و نەبزوێن لە ئەلفبێی لاتیندا زۆر ئاسانە، چونکوو هەر دەنگێك پیتی تایبەتمەندی خۆی بۆ دانراوە. لە ئەلفبێی عەرەبیدا چونکوو بزوێن و نەبزوێن پیتەکانیان جیا نەکراونەتەوە، تۆزێ زەحمەتە لێك جیا کرێنەوە، بەڵام ئەگەر پێش یان پاش ئەوان پیتێکی بزوێن هەبێت ئەوە ئەوان دەبنە نەبزوێن:
(شایان şayan)، (مەی mey)، (یانە yane)، (کەوان kewan)، (شەو şew)، (ورد wird).

## هەمزە (ء)

هەمزە، لە زمانی عەرەبی و فارسیدا، لە چەند شوێنێکی جۆربەجۆر بەکار دەچێت، وەکوو: (**أ ٱ إ لأ لإ ؤ ء ئـ**)، بەڵام لە زمانی کوردیدا تەنیا شێوازی (**ئـ**) بەکار دەبرێت، ئەویش بە مەبەستی ئەوەی نەهێڵێ دوو بزوێن بەدوای یەکدا بنووسرێن.
هەندێ لە زمانزانان هەمزە بە بزوێن دادەنێن و، لای هەندێکیش بە نەبزوێن دەناسرێت، بەڵام لەڕاستیدا کورد، هەمزەی بە شێوازی (**ئـ**) بەکار هێنا و بڕیاری دا وەکوو (**نەبزوێن**)ێك چاوی لێ بکات، بۆ ئەوەی نەهێڵێ دوو بزوێن بەدوای یەکدا، یان هەندێ بزوێن لە سەرەتای وشەدا بنووسرێن، نموونە:

| | |
|---|---|
| نـازاد = نـائـازاد | او = ئـاو |
| ەو = ئـەو | ۆخەی = ئـۆخەی |
| وروویا = ئـورووپـا | ێجگار = ئـێجگار |

# قرتاندنی (ئـ)

هەندێ جار ڕوو دەدات کە وشەیەك وا بە پیتێکی نەبزوێن کۆتاییی هاتووە، وەکوو: (شەو şew)، لەگەڵ وشەیەك کە بە (ئـ) دەستی پێ کردووە، وەکوو (ئاهەنگ aheng)، پێکەوە کۆ دەبنەوە و وشەیکی نوێ پێك دەهێنن کە واتایەکی نوێتری هەیە وەکوو:
شەو + ئاهەنگ = شەوئاهەنگ. لێرەدا پێویست ناکات (ئـ) بمێنێتەوە و دەتوانین بیقرتێنین، چونکوو پیتی پێش ئەو بزوێن نییە تا کێشە بێت. دەنووسین: (شەواهەنگ).

هەروەها:

کارئاسانی دەبێتە: کاراسانی.
ماڵئاوایی = ماڵاوایی.
بانئەفشار = بانەفشار (ناوی گەڕەکێکە لە شاری قەسری شیرین لە پارێزگای کرماشان).
کارئەندامزانی = کارەندامزانی (physiology).
تووڵئامراز = تووڵامراز (toolbar). (تووڵ، شیش = bar)، (ئامراز، کەرەستە = tool).

هەروەها:

| | |
|---|---|
| کەمەندام | چاوەسمەر |
| چاوەستێرە | گوڵەندام |
| گوڵەستێرە | شێرەندام |

خاکەناز

# کێشەی بزوێنی (وو)

(وو **û**) دەنگێکی بزوێنە و هەرگیز نابێ لە سەرەتای وشەدا بنووسرێت. زۆر هەڵەیە بنووسی: (ووشە ûşe، وورچ ûrç، وون ûn، ووس ûs و هتد)، بەڵکوو دەبێ بە (و w)ی نەبزوێن بنووسرێت، چونکوو دوای ئەو پیتە، **بزرۆکە** هەیە، کەوا بێت دوو بزوێن پێکەوە نانووسرێن و دەبێ وا بنووسرێن: (وشە wişe، ورچ wirç، ون win، وس wis و هتد).

بەڵام لە ناوەڕاست و کۆتاییدا دەنووسرێ:
(سوور sûr)، (نوور nûr)، (چوو çû)، (توو tû).

زۆر کەس بە هەڵە دەنووسن: "کەرکوك، مەحمود، حوکومەت و هتد". کە ڕاستییەکەی ئاوایە: کەرکووك، مەحموود، حوکوومەت و هتد

# کێشەی بزوێنی (ە **e**)

(ە **e**) سەرەڕای ئەوەی کە دەنگێکی بزوێنە، **کردار** (**فعل** **verb**)یکیشە کە لە "سێیەم کەسی تاك"دا، واتای (**is**)ی ئینگلیزی دەدات: (It **is** could = هەوا ساردە).
لە ئەلفبێی لاتیندا، کرداری (ە **e**) بەجیا دەنووسرێت:
(Hewa sard **e**)، بەڵام لە ئەلفبێی عەرەبیدا، دەلکێت بە وشەکەی پێشیەوە: (هەوا ساردە). نموونەی تر:
برامە، هاوڕێمە، کوڕە، کچە،
پێنووسە، دەستە، ڕێزمانە، کوردە،
بەردە.

.

# **کێشەی (یە)**

جاری وایە وشەکەی پێش (ە) بە پیتێکی بزوێن (**ا - و - ۆ - وو - ە - ی - ێ**)،کۆتاییی هاتووە، وەکوو: (مامۆستا)، ئەو کاتە ئیتر لە جیاتیی (ە) دەنووسین (یە): (مامۆستایە mamosta ye).

**تێبینی**: کرداری (یە)ش هەر وەکوو (ە) دەبێ بلکێنرێ بە وشەکەی پێشیەوە: (مامۆستایە)، نەك (مامۆستا یە). تەنانەت ئەگەر وشەکە بە (یی)ش کۆتاییی هات هەر پێکەوە دەنووسێنرێت: هەروەها:

(سپییە)، نەك (سپیە، سپیـیە، سپی یە).
(چییە)، نەك (چیە، چیـیە، چی یە).
(نییە)، نەك (نیە، نیـیە، نی یە).
(کوردییە)، نەك (کوردیـیە، کوردی یە).
(کۆیەیەییە)، نەك (کۆیەیە، کۆیەییە، کۆیەییـیە، کۆیەیی یە).
(سنەیییە) نەك (سنەیی یە، سنەییە).

# **کێشەی (ی)**

سەیری ئەم وشانە بکەن: (مەی mey)، (بی bî).

لەو دوو نموونەیەدا، (ی **y**) نەبزوێنە و دەنگێکی کورتە، بەڵام (ی **î**) بزوێنە و دەنگێکی درێژە، گەر سەرنج بدەن دەبینن کە لە ئەلفبێی عەرەبیدا، هەر دوو شێوەکەی (ی) وەکوو یەکن: (**ی**)، بەڵام لە لاتینیدا دوو جۆرن (**y**) و (**î**). واتە لە ئەلفبێی عەرەبیدا جیاکردنەوەی بزوێن و نەبزوێنی (ی) تۆزێ وردبوونەوەی دەوێ، بەڵام لە لاتینیدا، دوو شێوازی جۆربەجۆرن و بەو جۆرە جیاکردنەوەی بزوێن لە نەبزوێن زۆر ساناترە.

**یاسا**: (دوو دەنگی بزوێن بەدوای یەکتردا نابێ بنووسرێن).

سەیری ئەم وشەیە بکەن: (کوردی kurdî) + (ەکان ekan) = (کوردیەکان kurdîekan).

ئایا لەو نووسینەدا هەڵەیەکی گەورەمان نەکردووە؟ با، ئەویش ئەوەیە کە دوو بزوێنمان پێکەوە نووسیوە:
(یە îe). چار؟ دەبێ کەڵك لە پیتەیارمەتیدەر وەرگرین و بنووسین: (کوردییەکان kurdîyekan).
لە ئەلفبێی عەرەبیدا (ییـ) وەکوو یەکن، بەڵام لەڕاستیدا یەکەمیان بزوێنە و دووەمیان نەبزوێنە. ئەگەر سەیری لاتینییەکەی بکەین باشتر بۆمان ڕوونە: (îy). بۆیە گەر بزانین بە لاتینی چۆن دەنووسرێن، زۆر بەئاسانی لێك جیا دەکرێنەوە.

## کێشەی بزوێنی (ی î)

(**ی î**) دەنگێکی درێژە و بەداخەوە لە ئەلفبێی عەرەبیدا هیچ پیتێکی جیاوازی بۆ دانەنراوە. هەندێ لە نووسەران بۆ بزوێنی (**î**) هەموو کاتێ کەڵکیان لە (یی) وەردەگرت، تەنانەت لە ناوەڕاست و کۆتاییی وشەشدا و، وا دەیاننوسی:

(تییر tîr)، (سییر sîr)، (چییمەن çîmen)، (کوردیی kurdî)، (سیی sî)، (سلێمانیی Silêmanî)، (کفریی Kifrî). بەڵام چونکوو ناشیرین بوو، لە ناو نووسەر و خوێنەری کورددا جێی نەگرت و بەناچاری هەر یەك (ی) بۆی بەکار هێنرا: (تیر tîr)، (سیر sîr)، (چیمەن çîmen)، (کوردی kurdî)، (سی sî)، (سلێمانی Silêmanî)، (کفری Kifrî).

**بەکارهێنانی (یی)**: لەم شوێنانەدا کەڵك لە (یی yî) وەردەگیرێ:

(ڕەشایی reşayî)، (بەرایی berayî)، (دوایی diwayî)، (کۆتایی kotayî)، (پانایی panayî)، (شێنەیی şêneyî)، (کۆیەیی Koyeyî)، (سنەیی Sineyî)، (هەڵەبجەیی Hellebceyî)، (ڕانیەیی Ranyeyî)، (ورمێیی Wirmêyî) و (تەنیایی tenyayî).

# (ی)ی پێوەندی

(ی)ی پێوەندی ئەو دەنگی (ی)یەیە کە دەکەوێتە نێوان دوو ناو، یان ناوێك و ئاوەڵناوێکەوە: مامۆستای قوتابخانە. کچی شۆخ.

کێشەکە لەوەدایە کاتێ وشەیەك خۆی بە (ی) کۆتاییی بێت، وەکوو: (کوردی، ئیسلامی، کرماشانی، سنەیی، کۆیەیی)، هەندێ کەس ئیتر (ی)ی پێوەندییەکەیان لەبیر دەچێ بینووسن، کە هەڵەیەکی گەورەیە. بۆ نموونە لەباتیی "یەکێتی نیشتمانی کوردستان" دەبێ بنووسرێت: "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان".

دەبێ وردبین بین و نەهێڵین (ی)ی پێوەندی بقرتێنرێت، لەم نموونانەی خوارەوەدا (ی)ی پێوەندی ڕەچاو کراون:

| | |
|---|---|
| داری سەوز | قوتابخانەی سەرەتاییی کچان |
| کۆماری ئیسلامیی ئێران | کرماشانیی دڵسۆز |
| پەپوولەی خۆشەویستیی من | کۆیەییی هونەرمەند |
| کاکەییی کوردپەروەر | زاراوەی هەورامیی کۆن. |

# (ی)ی سێیەم کەسی تاك

هەندێ لە جێناوە لکاوەکان بریتین لە:

| | |
|---|---|
| ...م | ...مان |
| ...ت | ...تان |
| ...ی | ...یان |

وەکوو:

| | |
|---|---|
| خواردم | خواردمان |
| خوارت | خواردتان |
| خواردی | خواردیان |

جێناوی لکاوی سێیەم کەسی تاك (ی)یە. لە کاتی گەردانکردنی ئەو دۆخەدا، ئەگەر "بنە"ی کردارەکە خۆی بە (ی) کۆتاییی هات، (ی)ی جێناوی لکاو لەبیر مەکەن، نموونە:

| | |
|---|---|
| پرسیم | پرسیمان |
| پرسیت | پرسیتان |
| پرسیی | پرسییان |

دەبێ وا بنووسرێن: من پرسیم، تۆ پرسیت، ئەو پرسیی. (نەك ئەو پرسی).

نموونەی تر:

(دزین، بڕین، کڕین، گۆڕین، نووسین)، کە لە سێیەم کەسی تاکدا دەبنە (ئەو دزیی، ئەو بڕیی، ئەو کڕیی، ئەو گۆڕیی، ئەو نووسیی).

# کێشەی پیتی (ڕ)

"ڕ" دەنگێکی گڕە کە لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتاییی وشەدا دێت:
ڕاز، هەڕا، مەڕ.

**تێبینی:** نابێ (ڕ)ی گڕ لەگەڵ (ر)ی سادە تێکەڵ بکرێت.

**یاسا:** (هەموو دەنگێکی (ڕ) لە سەرەتای وشەدا گڕە و دەبێ بە (ڕ)ی گڕ بنووسرێت، نەك بە (ر)ی سادە).

هەندێ کەس لە سەرەتادا بەشێوەی (ر) دەینووسن و هێماکەی بۆ دانانێن. (ر) دەنگێکی سادەیە و زۆر جیاوازە لە (ڕ). لە سەرەتای وشەدا هەموو دەنگی (ڕ)ی زمانی کوردی، گڕە، دەبێ هەموو کاتێ بە هێماکەیەوە بنووسرێت. نابێ بوترێت: "ئێمە دەزانین هەموو دەنگێکی سەرەتا گڕە، کەوا بێت با بە (ر) بنووسرێت و خۆمان تێی دەگەین کە گڕە."
تەنانەت لەناو تەختەکلیلی کوردیشدا دوگمەیەك بۆ (ڕ) دیاری کراوە، زۆر سەیرە بێین دوگمەیەکی تر لەباتیی ئەو دوگمەیە بەکار بهێنین کە دەنگێکی ترە!

| | |
|---|---|
| ڕاست | ڕێگا |
| ڕۆخ | ڕژد |
| ڕەنج | ڕزگار |
| ڕەش | ڕەنگ |

ڕۆڵە

# کێشەی پێشگرەکانی
# (هەڵ، دا، ڕا، وەر، دەر)

ئەم پێشگرانە کاتێ دەچنە سەر چاوگ یان فرمان یان هەر شێوازێکی تر، پێیانەوە دەلکێن بەمەرجێ جێناوی لکاو نەکەوتبێتە نێوان پێشگر و وشەکەی دوای خۆی. وەك:

## چاوگ

**هەڵ**: هەڵکردن، هەڵگرتن، هەڵکورمان، هەڵکێشان، هەڵبڕین، هەڵخستن.

**دا**: دابڕان، داخستن، داڕمان، داگرتن، داکردن، دابەزین، داخورپان.

**ڕا**: ڕاگرتن، ڕاکێشان، ڕاپەڕین، ڕاخستن، ڕاگوێزان، ڕاگواستن.

**وەر**: وەرگرتن، وەرسووڕان، وەرگەڕان.

**دەر**: دەرکردن، دەرهێنان، دەربڕین، دەرخستن، دەرپەڕاندن.

# فرمان

**هەڵ**: هەڵگرە، هەڵخە، هەڵمەخە، هەڵکشێ.
**دا**: دانێ، دامەبڕە، دابەزێنە. داگرە.
**ڕا**: ڕاکێشە، ڕاپەڕێنە، ڕامەپەڕێنە. ڕاگرە.
**وەر**: وەرگرە، وەرسووڕێنە، وەرگەڕێ، وەرچەرخێ.
**دەر**: دەربێنە، دەرخە، دەرکە، دەرچۆ.

# دۆخی تر

هەڵکشاو، هەڵخراو، هەڵنەکشاو، هەڵخزێنراو. دانراو، داسەپاو، دابڕاو. ڕاپەڕێنراو، ڕاپەڕیو، ڕاگوێزراو، ڕاکشاو. وەرگیراو، وەرگرتوو، وەرگرتە، وەرسووڕاو، وەرگێڕاو. دەرهێنراو، دەرخراو، دەرکراو، دەرچوو.

# پێشگر و جێناوی لکاو

ئەگەر جێناوی لکاو (...م، ...ت، ...ی، ...مان، ...تان، ...یان) کەوتە نێوان پێشگر و فرمانەکەی دوای خۆی ئەوا بەجیا دەنووسرێن و جێناوەکە بە پێشگرەوە دەلکێنرێ:

**هەڵ**: هەڵم گرن، هەڵت گرن، هەڵیان کێشن، هەڵمان مەواسن، هەڵتان بڕن.

**دا**: دامان نەنایە، دایان خەن، دای بڕە.

**ڕا**: ڕایان دەگرن، ڕام کێشە، ڕاتان پەڕێنن، ڕاشیان پەڕێنن.

**وەر**: وەرمان گرتایە، وەری نەگری، وەریان سووڕێنە، وەرمان گەڕێنە.

**دەر**: دەریان پەڕاندین، دەری خە.

## گیروگرفتی فرمانی لێکدراو (فعل مركب compound verb)

فرمانی لێکدراو بەو فرمانانە دەوترێن کە لە دوو یان چەند وشە پێك هاتوون. وەک:
(ڕێك + کەوتن = ڕێککەوتن)، (پێك + هێنان = پێکهێنان).

ئەم فرمانانە ئەگەر لە دۆخی چاوگدا بن پێکەوە دەنووسرێن، وەك: ڕێکخستن، شەڕکردن، کۆڵنەدان، خەباتکردن، تاڵانکردن، تێکدان، سەربڕین.

ئەگەر لە دۆخە جۆربەجۆرەکانی فرمان (ئێستە، ڕابردووی سادە، ڕابردووی گێڕاوەیی، ڕابردووی دوور) بەکار ببرێن بەجیا دەنووسرێن:

**ئێستە**: ڕێك دەخەم ـ ڕێك دەخەی ـ ڕێك دەخات ـ ڕێك دەخەین ـ ڕێك دەخەن ـ ڕێك دەخەن.

**ڕابردووی سادە**: ڕێکم خست، ڕێکت خست ـ ڕێکی خست ـ ڕێکمان خست ـ ڕێکتان خست ـ ڕێکیان خست.

**ڕابردووی گێڕاوەیی**: ڕێکم خستووە ـ ڕێکت خستووە ـ ڕێکی خستووە ـ ڕێکمان خستووە ـ ڕێکتان خستووە ـ ڕێکیان خستووە.

**ڕابردووی دوور:** ڕێکم خستبوو ـ ڕێکت خستبوو ـ ڕێکی خستبوو ـ ڕێکمان خستبوو ـ ڕێکتان خستبوو ـ ڕێکیان خستبوو.

ئەگەر لە دۆخەکانی تردا بن هەروەکوو دۆخی چاوگ پێکەوە دەنووسرێن: پێکهاتن، پێکهاتوو، پێکهاتە، پێکهێنراو. سەرکەوتن، سەرکەوتوو.

**نموونەی تری گەردان (تصریف)ی فرمان (فعل):**

فرمان (فعل) لە دۆخی چاوگ (مصدر)دا پێکەوە دەنووسرێت: **ڕوونکردنەوە.** بەڵام لە دۆخەکانی تردا جیا دەکرێنەوە:

**تاك، دۆخی ئێستە:** ڕوونی دەکەمەوە، ڕوونی دەکەیتەوە، ڕوونی دەکاتەوە.

**کۆ، دۆخی ئێستە:** ڕوونی دەکەینەوە، ڕوونی دەکەنەوە، ڕوونی دەکەنەوە.

**تاك، ڕابردووی سادە:** ڕوونم کردەوە، ڕوونت کردەوە، ڕوونی کردەوە.

**کۆ، ڕابردووی سادە:** ڕوونمان کردەوە، ڕوونتان کردەوە، ڕوونیان کردەوە.

**تاك، ڕابردووی گێراوەیی (نقلی):** ڕوونم کردبووەوە، ڕوونت کردبووەوە، ڕوونی کردبووەوە.

**کۆ، ڕابردووی گێراوەیی:** ڕوونمان کردبووەوە، ڕوونتان کردبووەوە، ڕوونیان کردبووەوە.

**تاك، ڕابردووی دوور:** ڕوونم کردبوو، ڕوونت کردبوو، ڕوونی کردبوو.

**کۆ، ڕابردووی دوور:** ڕوونمان کردبوو، ڕوونتان کردبوو، ڕوونیان کردبوو.

## کێشەی (و)ی پێوەندی (بەیەکەوەبەستن)

پیتی **(و and)** وشەیەکی سەربەخۆیە و دەبێ سەربەخۆ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێ و نەلکێندرێ بە وشەکانی پێش و پاشی خۆی.
بۆ نموونە دەبێ بنووسرێ:

(من و تۆ) نەك (منو تۆ) یان نەك (منو تۆ).
(سەر و ماڵ) نەك (سەرو ماڵ) یان نەك (سەروو ماڵ).
(هیوا و ئاوات) نەك (هیواو ئاوات).

**سەرنج:** نموونەکانی سەرەوە هەر کامەیان سێ وشەی جیاوازن و پێکەوە مانایەکی نوێ پێك ناهێنن و هەر بەتەنیا مانای خۆیان پاراستووە و جیاوازییان هەیە لەگەڵ وشەی لێکدراو کە لە خوارەوە باسیان دەکرێ.

# وشەی لێکدراو (مرکب)

هەندێ جار دوو یان چەند وشە، کە هەر کامەیان بۆ خۆی واتایەکی هەیە، پێکەوە کۆ دەبنەوە و سەرجەم واتایەکی نوێتر پێك دەهێنن، بەم متوربەبوونە دەڵێن (**وشەی لێکدراو**). وشەی لێکدراو دەبێ بلکێن بە یەکەوە و نابێ بەجیا بنووسرێن و، بە چەند شێوە پێك دێن:

**١. بێ هیچ یارمەتییەك:**

جاری وایە "**وشەی لێکدراو**"، بێ هیچ یارمەتییەك دروست دەبێت و تەنیا **وشەکان پێکەوە دەلکێن**:

ڕەش + ماڵ = ڕەش ماڵ، کە پێکەوە واتایەکی تر پێك دەهێنن و ئەو کاتە دەبێ پێکەوە بنووسرێن: **ڕەشماڵ**.

خوێندن + گە = خوێندنگە.
زانست + پەروەر = زانستپەروەر.
پاش + بنەما = پاشبنەما.
کتێب + خانە = کتێبخانە.
مەلە + گە = مەلەگە.

**٢. بە یارمەتیی پیتی (و):**

جاری وایە "**وشەی لێکدراو**"، بە یارمەتیی پیتی **(و)** پێکەوە دەلکێن:

ئاڵ + و + گۆڕ = ئاڵوگۆڕ.
مشت + و + مڕ = مشتومڕ.
ئەلف + و + بێ = ئەلفوبێ.
دەنگ + و + باس = دەنگوباس.

**٣. بە یارمەتیی پیتی (ە):**

جاری وایە "**وشەی لێکدراو**"، بە یارمەتیی پیتەبزوێنی **(ە)** پێکەوە دەلکێن:

بەرد + ە + قارەمان = بەردەقارەمان.
گوڵ + ە + گەنم = گوڵەگەنم.
بەرز + ە + فڕ = بەرزەفڕ.
ئاگر + ە + دیوار = ئاگرەدیوار.

**نموونەی تری وشەی لێکدراو:**
خۆترنجێنەر، خۆکوژ، بەردباران، کاروبار، ئەلفوبێ، هاتوچۆ، زانستپەروەر، زانستخواز، ئازادیخواز، وڵاتپارێز، سێشەممە، ڕاستەوخۆ، نیشتمانپەروەر، گوڵەگەنم، ڕێنووس، باوکمردوو، یەکگرتوو، ئاڵوگۆڕ، ڕۆژنامەنووس، هەواڵنێر، پەیامنێر، بەرزەفڕ، جەرگبڕ، منداڵپارێز، چەمچەماڵ، بێکەس، جێبەجێ، دەستبەجێ، کانیکەوە، هەڵگورد، تاقبۆستان (تاقوسان)، ملهوڕ، تەختەکلیل، پاشبنەما، بنکەدراوە (databa)، بەستهێڵ (dash)، ڕوومێز (desktop)، زانیارینامە (encyclopedia)، ئاگرەدیوار.

### پیتی (ت) لە کۆتاییی فرماندا

پیتی (ت) لە کۆتاییی فرماندا هەم دەتوانرێ بنووسرێ و هەمیش دەتوانرێ نەنووسرێت، وەکوو:

(دێ و دەڕوا) یان (دێت و دەڕوات).

(نان دەکا) یان (نان دەکات).

## وشەی بیانی

هەر وشەیەکی بیانی هاتبێتە ناو کوردییەوە دەبێ بە ڕێنووسی کوردی بنووسرێت یان ئەگەر پێویست بوو وەکوو خۆی بنووسرێتەوە دەبێ بخرێتە ناو دوو کەوانەوە.

ئەڵڵا، قەڵەم، ئەکبەر.

لە زمانی کوردیدا بە (مذهب) دەڵێن "ڕێباز".

**ئامرازی (تر) و وشەی (تر)**

**ئامرازی بەراوردکردن (تر، ترین)**

دەبێ بلکێن بە وشەکانی پێشیانەوە، وەکوو:

جوان، جوانتر، جوانترین
گەرم، گەرمتر، گەرمترین.

# وشەی (تر) بە واتای (دی، دیکە)

وشەی (تر) وشەیەکی سەربەخۆیە و دەبێ بەجیا بنووسرێت:

کابرایەکی تر، شەوێکی تر، نووسەرێکی تر

# پاشگرەکانی (دا، ڕا، وە، ەوە)

دەبێ بلکێن بە وشەکانی پێشیانەوە، وەکوو:

**دا**: لە ماڵدا چاوم پێ کەوت.
**ڕا**: لە کوێڕا هاتی؟
**وە**: لە کوێوە بۆ کوێ؟
**وە**: لە هەوەڵەوە بیگێڕەوە.

# فرمانی (دا)

وشەی (**دا**) کە ڕابردووی (**دان، دایین**)ە جیاوازیی هەیە لەگەڵ پاشگری (**دا**) و، دەبێ بەجیا بنووسرێت:

لە ماڵدا نامەکەم پێ دا. (نەك پێدا).
لە کوردستاندا لاوان گوێیان لە دوژمن نەدا. (نەك دوژمننەدا، نەك دوژمن نە دا).
بەڵێنم دا سبەی بیبینم. (نەك بەڵێمندا).
ئاخری وەڵامی دایەوە. (نەك وەڵامیدایەوە).

## **کێشەی (لە)**

(**لە**)، هەندێ جار سەربەخۆ دەنووسرێت: "شۆڕش لە کوردستاندا گەرمە."

هەندێ جار دەلکێ بە وشەکەی پاشیەوە و وشەیەکی لێکدراو پێك دێنێ: (**لەگەڵ with**)، (**لەسەر on**)، (**لەژێر under**). لەو دۆخانەدا نابێ بە دوو وشە جیا کرێنەوە و بنووسرێ: (لە گەڵ، لە سەر، لە ژێر).

(**لە**)، هەندێ جار لەگەڵ (**ئەوێ**) و (**ئێرە**) کۆ دەبێتەوە و ئەو کاتە، (ـە) و (ئـ) دەقرتێنرێن:

لە ئەوێ = لەوێ.
لە ئێرە = لێرە.

## **(بێ) یان (بەبێ)؟**

لێرەدا دەمانەوێ بەراوردکارییەك لەگەڵ زمانە ئەورووپییەکاندا بکەین، بۆ ئەو مەبەستە باشترە بە نموونەیەك دەست پێ بکەین:

جیاوازیی (بێکار) لەگەڵ (بێ کار) لە چیدایە؟ لکاندن یان نەلکاندنی (بێ) بە وشەکەی پاشی خۆیەوە بەتەواوی واتای وشەکە دەگۆڕێ:
ئەو پیاوە دوو ساڵ بێکار بوو.
بێ کار ژیان ئەستەمە.
دەکرێ ئاواش بینووسینەوە: بەبێ کار ژیان ئەستەمە.
هەر کاتێ ناوێکت هەبوو و خاوەنێتییەکی لێ سەندرابێتەوە (بێ) دەلکێنین بە سەرەتای وشەکەوە:
بێباوك، بێخانوو، بێکەس، بێوڵات، بێنیشتمان، بێپارە، بێتام:

واتە: کەسێ کە باوکی نییە. کەسێ کە خانووی نییە و هتد.

ئەم مەبەستە، لە زمانە ئەورووپییەکاندا، زۆر جار بە پاشکۆیەك کە دەلکێ بە وشەکەوە دیاری دەکرێت:
بێخانوو = homeless
بێتام، بێچێژ = tasteless
کە جیاوازیی هەیە لەگەڵ (without):
بێ تۆ ناچم بۆ ئەوێ = I do not go there without you
(بێـ...) = (...less)
(بێ، بەبێ) = (without)

## ئاوەڵکار (قید)

کاتێ وشەیەك چۆنێتیی (کار، فرمان، کردار = فعل)ێك ڕوون کاتەوە پێی دەوترێ ئاوەڵکار (قید). نموونە:

ئاسۆ بەخێرایی قسەی دەکرد. (چۆن قسەی کرد؟ "بەخێرایی")
سۆما بەتووڕەیی وەڵامی دایەوە. (چۆن وەڵامی دایەوە؟ "بەتووڕەیی")
لانە بەئەسپایی هاتەوە. (چۆن هاتەوە؟ "بەئەسپایی).

ئەوەی لێرەدا جێگای سەرنجڕاکێشانە، ئەوەیە کە "**بە**" دەلکێ بە ئاوەڵناوەکەی پاشیەوە و، نابێ لێك دوور خرێنەوە. نموونەی تر:

بەجوانی، بەشادی، بەبەرزی، بەهێواشی، بەتوندی.

ئەم شێوازە لە زمانی ئینگلیزیدا (**ly**) دەگرێت و دەلکێ بە ئاوەڵناوەکەوە: (بەسەختی hardly).

# پێشەکی

لە نووسینی دەقێکدا، سەرەڕای ڕەچاوکردنی کۆمەڵێ یاسا و ڕێسای نووسین، نووسەر دەبێ ڕەچاوی

**یاساکانی خاڵبەندیش** بکات. دەقێ کە خاڵبەندی تێیدا ڕەچاو نەکرابێ، دەبێتە هۆی سەرلێشێواندن لە

خوێنەر و، لە ئەنجامیشدا، بەهەڵەتێگەیشتن لە نووسراوەکە.

ئەو نیشانانەی لە خاڵبەندیدا زۆر بەکار دەبرێن بریتین لە:

١. خاڵ، کە بەم شێوەیەیە: (.).

٢. جووتخاڵ، کە بەم شێوەیەیە: (:).

٣. بۆر، کە بەم شێوەیەیە: (،).

٤. خاڵبۆر، کە بەم شێوەیەیە: (؛).

٥. نیشانەی پرس، کە بەم شێوەیەیە: (؟).

٦. نیشانەی سەرسوڕمان، کە بەم شێوەیەیە: (!).

٧. جووت کەوانەی بچووک، کە بەم شێوەیەیە: « ».

٨. جووت کەوانەی گەورە، کە بەم شێوەیەیە: (   ).

٩. هێڵ یان تەقەڵ، کە بەم شێوەیەیە: (-).

١٠. سێ خاڵ، کە بەم شێوەیەیە: (...).

١١. بۆشایی.

١٢. هێڵی لار (/)، (\) و پیتی (ر):

**یەکەم: خاڵ (.):**

خاڵ لەم شوێنانە دادەنرێت:

١. لە کۆتایی هەموو ڕستەیەکدا، جگە لە پرس و سەرسوڕمان، وەک:

نەورۆز یەکەم مانگی کوردییە.

دوێنێ نامەکەم نووسی.

٢. لە دوای یەکەم، یا یەکەم و دووەم پیتی ناوێک کە پێش ناوهێنانی پاشناوەکەی بکەوێت، وەک:

ع. شەرەفکەندی.

م. م. بەدرخان.

٣. بۆ کورتکردنەوەی هەندێ پیشە و نازناو و ڕێکەوت، دوای یەکەم پیت دادەنرێ، وەک:

پێغەمبەر (د. خ.). (پێغەمبەر درووودی خودای لێ بێ).

پ. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ. (پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ).

د. سۆران. (دوکتۆر سۆران).

مادەکان ٧٠٠ ساڵ پ. ز. (پێش زایین) سەریان هەڵدا.

٤. دوای سەردێڕ خاڵ دانانرێ، مەگەر لە چەند ڕستە پێک هاتبێت.

٥. هەندێ جاریش لە جیاتیی نیشانەی سەرسوڕمان لە دوای ئەو ڕستانەی دادەنرێ کە داواکارییان

تێدایە، وەکوو:

وەڵامەکانتان بەراورد بکەن.

٤. ئەوڕۆکە کاتێ لە پرۆگرامێکی وەك (Word) بتەوێ دێڕەکانت بە ژمارە دیاری بکەی، خۆی ئۆتۆماتیك پاش

ژمارەکان خاڵ دادەنێ، وەك:

١. مرۆڤ بۆی هەیە بیروڕای خۆی دەربڕێ.

٢. کەس بۆی نییە بیروبۆچوونی کەسێ بخاتە ژێر پرسیارەوە.

٣. هەموو كەسێ مافی یەكسانی هەیە لە كۆمەڵگادا.

سەرنج: خاڵ، دەبێ بلكێنرێ بە وشەكەی پێشیەوە و بۆشاییی هەبێ لەگەڵ وشەی دوایدا.

**دووەم ـ جووتخاڵ (:):**

جووتخاڵ لەم شوێنانە دادەنرێت:

١. لە پێش ئاخاوتنێكەوە كە وەك خۆی بگێڕدرێتەوە، یان بگوترێت، وەك:

ئاسۆ وتی: «من خەڵكی كوردستانم.»

٢. لە دوای وشەیەك یان باسێك، كە پێویستی بە تەفسیر و ڕاڤە و لێكدانەوە بێت، وەك:

میرنشینە كوردییەكان بریتی بوون لە: ئەردەڵان، سۆران، بادینان، بابان، هەكاری و بۆتان.

٣. پێش هێنانەوەی نموونە، لە بری: (بۆ وێنە، وەكوو، بۆ نموونە...)، لەم دۆخەدا دەتوانرێت تەقەڵێكیش دوای

جووتخاڵەكە دابنرێت، وەكوو:

ئاسمانی ئەدەبی كوردی پڕە لە ئەستێرەی درەوشاوە:-

نالی، مەحوی، گۆران، هێمن و هتد.

٤. زۆر جار لە نێوان کاتەکانی کاتژمێرێکدا هێمای جووتخاڵ بەکار دەچێ، وەکوو: ٢٠:١٠:٢٢

(کاتژمێر ١٠ و ٢٠ خولەك و ١٢ چرکە).

سەرنج: جووتخاڵ، دەبێ بلکێنرێ بە وشەکەی پێشیەوە و بۆشاییی هەبێ لەگەڵ وشەی دوایدا.

**سێیەم - بۆر (،):**

بۆر نیشانەی پشوویەکی کورتە، لەو شوێنە دادەنرێ کە وا لە ڕستەکە بکات ئاسان بخوێنرێتەوە، ڕوون بێت و

بەباشی تێ بگەیەنرێ. بۆر، چارەسەرێکی باشە بۆ ڕستەی دوورودرێژی پشووبڕ.

وە لەم شوێنانە دادەنرێ:

١. لە دوای ناوی بانگکراوەوە، وەك:

کچینە، هەوڵ بدەن، بە هەوڵدان دەگەنە ئامانج.

٢. لە نێوان جێگر و جێلێگیراودا، وەك:

مەستوورەی کوردستانی، هۆنەر و مێژوونووس، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دەژیا.

٣. لەو شوێنانەی کە ژماردن و دووپاتبوونەوەی تێدایە، وەك:

خوێ، ڕۆن، پیاز و برنج هەموو ئەو شتانەیە کە پێویستن.

زانیارییەکی باش، باشی هەبوو.

٤. بۆ جیاکردنەوەی وشەی سەرسوڕمان و وشەی بانگلێکراو لە ڕستەدا، وەك:

ئۆف، چ هەوایەك!

پێنووسەکەم بدەرێ، ئاسۆ.

٥. بۆ دابڕینی زنجیرە وشەیەك لە یەکتر، کە دوو دوو و پێکەوە بەکار هێنرابن، وەك:

پێشمەرگە بە برسییەتی و تینوویەتی، بە هیلاکی و ماندوویەتی، کۆڵی لێ نادات.

٦. لە دوای گێڕانەوەیەکی ڕاستەوخۆ، بۆ نموونە ئەگەر قسەکەر، قسەیەکی کۆنی خۆی بگێڕێتەوە، وەك:

خۆم وتم، "چێکردنی ماڵپەڕ زۆر ئەستەم نییە."

٧. لە پێش ئامرازی لێکدەری (وە، یا، یان)ەوە، بە مەرجێك نەکەوتبێتە سەرەتای ڕستەوە، وەك:

نە تۆ هاتبووی بۆ کۆبوونەوەکە، وە نە ئاراسی هاوڕێت.

یا نامەکە بنووسە، یان پەڕتووکەکە بخوێنەرەوە.

٨. لە دوای وشەی (بەڵێ، نە و نەخێر)ەوە، وەك:

بەڵێ، نامەکەم نارد.

نە، لەو کاتەدا ناتوانم بەشدار بم.

٩. لە باتیی فرمانێك بۆ ئەوەی دووپات نەبێتەوە، وەك:

من دەچم بۆ سلێمانی و ئەویش، بۆ هەولێر.

١٠. لە ڕستەی لێکدراودا، دەتوانرێت لە بری ئامرازی لێکدەری (و) بەکار بهێنرێت، وەك:

شنۆ ویستی بچێ بۆ شایی، جلی لەبەر کرد، خۆی ڕازاندەوە، تەلەفۆنی لە هاوڕێکانی کرد، یەکیان گرت، خۆیان گەیاندە شاییەکە.

١١. دەتوانرێ لە بری (کە)ی لێکدەر لە ڕستەدا بەکار بهێنرێت، وەك:

پێم خۆشە، پێکەوە بچین بۆ سینەما.

سوپاست لێ دەکەم، سەرت لێ دام.

**سەرنج**: بۆر، دەبێ بلکێنرێ بە وشەکەی پێشیەوە و بۆشاییی هەبێ لەگەڵ وشەی دوایدا.

**چوارەم ـ خاڵبۆر (؛):**

خاڵبۆر بۆ وچانگرتنێکی درێژتر لە بۆری سادە، بەکار دەهێنرێت. زۆر جار، لەو ڕستانەی کە زۆر لێک

نزیکن لە باتیی خاڵ دادەنرێ، وەک:

لەم ساڵانەی دواییەدا، کوردێکی زۆر پەڕیوەی هەندەران بوون؛ کوردەکان دەتوانن سوودێکی زۆر بە گەلەکەیان بگەیەنن.

**پێنجەم ـ نیشانەی پرس (؟):**

نیشانەی پرس، دەخرێتە کۆتاییی ئەو ڕستانەی کە پرسیاریان تێدایە، وەک:

١. پێنووسەکەت چی لێ کرد؟

٢. ئایا دەزانی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی چ ساڵی دەر چوو؟

**شەشەم ـ نیشانەی سەرسوڕمان (!):**

ئەم نیشانەیە هەم بۆ سەرسوڕمانە، هەم بۆ ئەمرکردن یان داواکردنە.

١. لە کۆتاییی ئەو وشانە، یان ئەو ڕستانەی کە سەرسوڕمان، یان پەژارەیی، یان هەستێکی دەروونیی تێدایە، بەکار دەهێنرێت.

وەک:

چ هەستێکی بەسۆز!

چەند دەنگت خۆشە!

ئای! ئەوە لێرەیت!

ئۆخەی! ئاڵای کورد هەڵکرا.

ئای لەو مانگە! چ جوانە!

٢. هەندێ جار لە کۆتاییی ئەو ڕستانەی کە فرمانپێدان یان داواکردنیان تێدایە، بەکار دەبرێ، وەک:

بڕۆ دەرەوە!

دەرگاکە داخە!

بەجێم مەهێڵە!

**حەوتەم ـ جووت کەوانەی بچووک « »:**

هەندێ جاریش هێمای "  " لە جیاتیی جووت کەوانەی بچووک بەکار دەبەن و، لەم شوێنانە بەکار دەبرێ:

١. کاتێ بمانەوێ گرنگیی تایبەتی بدەین بە وشەیەك، یان دەستەواژەیەك، یان ڕستەیەك، دەیخەینە ناو ئەو هێمایانەوە، وەکوو:

زانایان «زمان» بە کۆڵەکەی نەتەوە دادەنێن.

من "مێژوو" بە چرای تاریکستانی داهاتوو دەزانم.

کاتێ بتوانین «ئەلفبێ جۆربەجۆرە کوردییەکان» بکەین بە «یەك ئەلفوبێ»، ئەو کاتە گەلێ کێشەمان چارەسەر دەبێ.

٢. وتەیەك کە ڕاستەوخۆ دەگێڕدرێتەوە و ناشکێنرێت و دەستکاری ناکرێ، دەخرێتە ئەو ناوەوە، وەك:

پیاوە گەنجەکە وتی: "ڕاست دەکەی، ئێمە یارمەتیت دەدەین، من ڕابین هوودم."

قازی موحەممەد، چاونەترس ڕووی تێ کردن: «ئێوە ئەمڕۆ قازی موحەممەدێك دەکوژن، سبەینێ لە هەر دڵۆپە خوێنێکی من، سەدان قازی موحەممەدی تر سەر هەڵدەدەن.»

**سەرنج**: ئەگەر ڕستەکە بە خاڵ، بۆر، هێمای پرسیار، هێمای سەرسوڕمان و هتد کۆتاییی هات، ئەوانەش دەخرێنە ناو کەوانەکانەوە.

**هەشتەم ـ جووتە کەوانەی گەورە ( ):**

جووت کەوانەی گەورە بە چەند مەبەستێك بەکار دەچێ:

١. وشەیەك، یان ڕستەیەك دەخرێتە نێوانی، کە واتایەکی تایبەتیی تری هەبێت، وەك:

پیرەمێرد (حاجی تۆفیق) لە وەرگێڕانی هۆنراوەدا، دەستێکی باڵای هەبوو.

شاری سلێمانی (کە کەوتۆتە دامێنی چیای ئەزمەڕ) سلێمان پاشای بابان بنیادی ناوە.

٢. وشەی بێگانە، وەك:

ئاگرەدیوار (firewall) پێش بە خۆترنجێنەران دەگرێ بۆ ناو کۆمپیۆتەرەکەت.

میری (حکومت) فرمانی کاولکردنی ناوچەکەی زوو دەرکردبوو.

بۆ نووسین بە کوردی پێویستە تەختەکلیل (keyboard)ێکی کوردی دامەزرێنی.

٣. ساڵی دەستپێك و کۆتایی ڕووداوێ، یان ساڵی لەدایکبوون و کۆچکردنی کەسێ، وەک:

سنووری دەوڵەتی حەسنەوی (٩٤١ ـ ١٠١٤) کە پارە و پوولیشیان هەڵکەندبوو، هەمەدان، مەهاباد، کرماشان و شارەزوور بوو.

حەمە پاشا (١٧٨٣ ـ ١٨٤٦)، کە بە پاشای کۆرە بەناوبانگە، توانیی لە ساڵی ١٨٢٠دا سەربەخۆیی کوردستان لە ڕەواندز ڕاگەیەنێ.

**تێبینی**: کەوان کە دادەخرێ نابێ بکلێنرێ بە وشەکەی پاشیەوە، بەڵام ئەگەر وشەکە هێشتا تەواو نەبوو دەبێ بلکێت بە کەوانەوە، وەك:

ئەمساڵ (حج)ێکی کرد.

وشەی (file)یان لە کوردیدا کرد بە «پەڕگە».

**سەرنج**: وشەکانی ناو کەوانەکان نابێ لەگەڵ کەوانەکاندا بۆشاییان هەبێ.

**نۆیەم - هێڵ یان تەقەڵ (-):**

ئەم نیشانەیە لەم شوێنانەدا بەکار دەهێنرێت:

١. بۆ جیاکردنەوەی دوو کەسی گفتوگۆکەر، بۆ ئەوەی هێندە نەنووسرێ "وتی"، وەك:

سۆز ڕووی کردە ئاکۆ و وتی:

- ئاکۆ، گوێت لە سەربازەکانە؟

- بەڵێ، دیارە هەر بە دوامان دەگەڕێن.

- تۆ بڵێی بماندۆزنەوە؟

- خەمت نەبێ، ناتوانن.

- ئەگەر کوژرام، دڵنیا بە لە گۆڕیشا هەر خۆشم دەوێی.

٢. دەتوانرێ لە بری ئەو کەوانە گەورەیە بەکار بهێنرێ کە لە خاڵی یەکەمی جووتە کەوانەی گەورەدا باسمان کرد، وەك:

پیرەمێرد ـ حاجی تۆفیق ـ لە وەرگێڕانی هۆنراوەدا، دەستێکی باڵای هەبوو.

دەتوانی هەرچەندە میوە ـ جگە لە مۆز ـ پێت خۆشە، بخۆی و، سەرەڕای ئەوەش کێشەکەت دابەزێ.

٣. لە نێوان ژمارە و ژمێرراودا، ئەگەر کەوتە سەرەتای ڕستەوە، هەر چەند دەکرێ خاڵیش دابنرێ، وەك:

هەندێ لە مەرجەکانی بڵاوبوونەوەی بابەت بریتین لە:

١ـ بابەتەکە دەبێ سوودگەیەنەر بێت.

٢ـ ڕەچاوکردنی ڕێنووسی کوردی.

٣ـ ڕەچاوکردنی خاڵبەندی.

٤ـ سەرچاوەکان دەبێ دیاری کرێن.

**وەك وتمان دەشکرێ خاڵ دانێین:**

١. بابەتەکە دەبێ سوودگەیەنەر بێت.

٢. ڕەچاوکردنی ڕێنووسی کوردی.

٣. ڕەچاوکردنی خاڵبەندی.

٤. له كۆتاییی دێڕێكدا ئەگەر هەموو وشەكە جێی نەبووەوە و ویستت بەشێك له وشەكە هەر لەو دێڕە

بنووسی تەقەڵ دادەنێی، وەك:

............................. ڕێیا ـ

زەكان ...........................

**تێبینی**: لەم شوێنانە تەقەڵەكە بێ بۆشایی دەنووسرێ:

كاتی ئاوەڵابوون: ١٢ـ١٦.

له هەفتەیەكدا ٧ـ٨ میل ڕا دەكات.

**دەیەم ـ سێ خاڵ (...):**

ئەم «سێ خاڵ»ە له بری وشە، یان ڕستە، كه قرتێنراوە، بە مەبەستی كورتكردنەوە، بەكار دەبرێ، وەك:

من سنە، كرماشان، مەهاباد، سلێمانی، كەركووك و ...م چاو پێ كەوتووە.

له كوردستاندا نەوت، ئاسن، زێڕ، زیو، گۆگرد و ... دەست دەكەوێ.

بیستووتە ...؟

فریام كەون! فریام كەون! فر...

**سەرنج**: ئەگەر لە نیوەی وشەکەدا پێویست بە "سێ خاڵ" هەبوو ئەوە دەلکێ بە وشەکەوە ئەگینا دەبێ سەربەخۆ بنووسرێ.

**یانزەیەم ـ بۆشایی (space):**

بە مەودای نێوان دوو وشەی سەربەخۆ دەڵێن «بۆشایی». ئەمە زیاتر لە نووسین بە کۆمپیۆتەر و

کەرەستەی نووسین زۆر گرنگە. سەیری ئەم نموونەیە بکەن:

(ئاڵای شەکاوە ـ ئاڵایشەکاوە)

لە یەکەمدا بۆشایی هەیە، لە دووەمدا بۆشایی نییە. دیارە ئەوەی یەکەم ڕاستە.

یان هەندێ جار لەو شوێنانەی کە پێویست بە « بۆشایی» ناکات، بۆشایی دادەنێن، وەکوو:

"لە گە ڵ" کە دەبێ بنووسرێ "لەگەڵ".

نووسەر دەبێ بزانێ لە چ شوێنێکدا "بۆشایی" پێویستە، یان پێویست نییە، ئەگینا وشەکان واتای هەڵە دەدەنە دەستەوە و تێگەیشتنیان قورس دەبێت.

**سەیری چەند نموونەیەك بکەن:**

(باسکرا) دەبێ بۆشاییی هەبێ: (باس کرا).

(وامەکە) دەبێ بۆشاییی هەبێ: (وا مەکە).

(جێیهێشت) دەبێ بۆشاییی هەبێ: (جێی هێشت).

(خۆشمدەوێی) دەبێ بۆشاییی هەبێ: (خۆشم دەوێی).

**تێبینی:** (و)ی پەیوەندی، وشەیەکی سەربەخۆیە و دەبێ هەموو کاتێ لەگەڵ وشەکانی پێش و پاشیەوە بۆشاییی هەبێت:-

(کرێکارو وەرزێر) دەبێ بۆشاییی هەبێ: (کرێکار و وەرزێر).

(گڕو تین) دەبێ بۆشاییی هەبێ: (گڕ و تین).

**وشەی لێکدراو نابێ بۆشاییی هەبێ، وەك:**

(خۆل کێش) نابێ بۆشاییی هەبێ: (خۆڵکێش).

(وێنە کێش) نابێ بۆشاییی هەبێ: (وێنەکێش).

(سکاڵا نووس) نابێ بۆشاییی هەبێ: (سکاڵانووس).

(لە گەڵ) نابێ بۆشاییی هەبێ: (لەگەڵ).

(جێ ژوان) نابێ بۆشاییی هەبێ: (جێژوان).

(باوك مردوو) نابێ بۆشاییی هەبێ: (باوکمردوو).

**لەم هۆنراوەیەی مامۆستا هێمندا، دەبینن کە دانانی بۆشایی لە (کەماڵ)دا چەندە ماناکە دەگۆڕێ:**

کەماڵت بێ کەماڵت بۆ چییە لەو شارە وێرانە؟

کەماڵی دەوڵەمەندی دی، گوڵم نەیویست کەماڵی من

کە دیارە دەبێ ئاوا بنووسرێ:

کە ماڵت بێ، کەماڵت بۆ چییە لەو شارە وێرانە؟

کە ماڵی دەوڵەمەندی دی، گوڵم نەیویست کەماڵی من

**دوازدەیەم ـ هێڵی لار (/)، (\) و پیتی (ر):**

١. بۆ نووسینی ڕێکەوت کە بە ژمارە دەنووسرێ، کەڵك لە هێڵی لاری (/) وەردەگرین، وەك:

شاری کەرکووك لە ٢٠٠٣/٤/١٠ ڕزگار کرا.

٢. بۆ نووسینی «دابەشکردن» لە ناو دەقێك کە پیتی تێدا بەکار چووە، کەڵك لە هێڵی لاری (\)

وەردەگرین، وەك: خێراییی تێشك (٣٠٠ هەزار کم\چرکە)دایە.

٣. پیتی (ر) لە ناو ژمارەدا لە جیاتیی (ممیز) بەکار دەچێ، وەك:

ـ ٢٣ر٠

ـ ٤٨ر١٢

ڕەچاوکردنی خاڵبەندی دەبێتە هۆی ئەوەی کە نووسەر مەبەستەکەی بەباشی بگەیەنێتە خوێنەر و، خوێنەریش بە هەڵە لە مەبەستەکە تێ نەگات.

## من و شه و وته نیایی وقه له م

* من وقه له م له ته نیا یی نیوه شه ودا *

من و قه له م ، له ته نیایی شه وه زه نگیکی ، مه ودا دریژی وه رزی زستانی سرا ، له ناو ژووریکی کپ وبیده نگا،

چرکه ساته کانی تاریکاییمان ده دوزی وته نانه ت تاله مووه ئالوزاوه کانیشمان شی ده کرده وه وله شه مان ده دان وخرمانی وشه مان شه ن ده کرد و ورد و درشتمان لیک جیا ده کرده وه وله سه ر نه پچری رسته به ملوانکه ی

په خشان ده مان هونینه وه . کاتژمیری ژووره که : چرک ، چرک ، چرک ، دارجووخینیکی له سه ر سنگی ره قی

چه قاندبوو ، خه ریکی گیره و هه لسوورانی بوو که بو ساتی له وه ستان نه ده که وت . بارانیش له و دیوی په نجه ره که وه تنوک ، تنوک ، له نجه ی ده کرد و خش ، خش ، خش ، هه رخه ریکی شیلانی شان وپیلی به فر و سه هولی ناو کولانه کان بوو، ده تگوت پیریژنه به لیخه لیخ قوری هه وران خوشه کا ، قاچی دریژی ته واو، ته واو به

رنوه زله کان هه لکیشابووه . هیشتا تینی کووره خوشه ویستی نیو باوه شی مالان بوو.

ئه و زستانه پیله ته نه گورزوه شینه م ،هه ر وه کوو کابرایه کی زه به لاحی زگ زه لامی له کارکه وتوو ده هاته به رچاو ،که به ته مه نیکی زوره وه شروشیتالی دنیای له خویه وه پیچابوو،به ره نگ زه ردی به سه رعه رزا پان و فلیچ ببووه . ده نگی پیی شنه ی واده م ده هاته گوی ، که به ئه سپایی به ره و ژوانی چلان ده جوولا ، لار و له نجه ی دارستانم

به دی ده کرد که چاوه روانی به زمی جیژوانی بوون .

من و قه له م ته نیا نه بووین ، به لکوو شه وی مه ندی بی ئه ستیره ش له گه لمان بوو ، باوه شی گه رمی خوی بو ئاوه لا کردبووین وئامیزی خاموشی خوی بو کردبووینه لانکه و نه رم ، نه رم رایده ژه ند ین وسه بر،سه بر ده یلاوانده وه ونوقمی ده ریای بیده نگی و بیهه رای کردبووین .

# نووسراوی ئه ده بی

## دوو بالی په پووله ی هیوا

من وته نیایی ، دوو بالی په پووله ی هیواین ، که چاوه روانی چاو هه لینانی خونچه گولیکی نه پشکووتووین له نیو باخچه ی به گول چینراوی به هاری ژینا. من و هیوا دوو سوارچاکی مه یدانی ئه وین ، شه و ده پیوین . له سه ر زینی ئه سپی شه فه ق ،یال و پرچی کازیوه مان توند گرتووه . بو پیشوازی له بسکی زیرینی گزینگی به یان ، له ریکابی ناز وعیشوه ی شنه ی شوخ و شه نگا شووشه ی ره شی ئه نگوسته چاو ده شله قینین و به ره و هه واری کورده واری ته قله ده که ین و جلیت داوییین. هه ورازی رژد ده برین وبونی هه لاله ی بژوینان وسویسنه ی نواله ی لابه

فران و وه نه وشه ی ناو داره ستان و گه زیزه ی شاخ و هه ردان تیکه لاوی ئاوی حه یات ده که ین ووه کوو هه توان ده یده ینه ده ست شنه ی زریان ،بو ئاوپرژینی میشکی ژه نگ لینیشتووی خه ولیکه وتوان . بو بیداری له خه وی قورس . بو هه لمژینی ئازادی . بو بینینی ژیانی بی ئیش ، بی ئازار . بوده ربرینی هه ست وسوزی نادیار .

## بوچی ده بی فیری زمانی زگماکی بین

ئه گه رچی گه لی کوردی چه وساوه ، له قوولایی میژووه وه ناوی هه یه ونه ته وه یه کی دریژخایه نی خاوه ن ولاتیکی پاریززاوه ، زانا و گه وره پیاوی زوری تیدا هه لکه وتووه وپاله وان و نه به زه کانی له ناو گه لانی ده ور و به ردا ویردی سه ر زمانن ، به لام به هوگه لی جوراوجورنه یانتوانیوه به باشی زمانی زگماکی خویان فیر ببن و له سه ر رینووسیکی یه کگرتوو بناغه ی بو داریژن . له ئه نجامدا ساویلکه یی ونه خوینده واری و نه زانی خویان زمانی بیگانه ی به سه ردا سه پاندوون . هه ر نه ته وه یه ک که بیهه ویت ناسنامه ی له م سه ر زه ویه به ره سه نی بهیلیته وه وله توانه وه ی له ناو گه لانی دیکه خو رزگار کات ، پیویسته ژیله موی ئاگردانی زمانی نه ته وه یی ببوژینیته وه و خوله میشی فه راموشی له سه ر پولووی نیو باوه شی کوانووی گه له که ی لابدا وزاناکانی میشکیان بخه نه گه رو هه لو ئاسا به ره و به رزایی بفرین وله سه ر هه لکشاوترین شاخی لووتکه ی ئاوات هیلانه ی عه شق و ئه وین ساز بکه ن وبه هه موو وزه وهیزیانه وه ، بژوین وقه د وداوینی چیا به رزه کان به نووکی پینووس ئاوپرژین که ن وگولی هیوا له لاپه ره ی ژیانیاندا بگوورینن . به بروای من هه ر کوردیکیش گه ر داخوازی پته و کردنی زمانه که ی بیت ، له پیش هه رشتیکدا ده بی شوینی زانست که ویت وزانیاری خوی تا ئه و جیگه ی ده توانیت بباته

سه ره وه وهه ول بدات سه باره ت به زمانی نه ته وه یی ومیژووی گه له كه ی خوی ئاگاداری ببیت . پیویسته چه كی زانین و هونه رهھلگریت بو پیشكه وتن و زانیاری ، بو ئه وه ی مه شخه لی خوینده واری به زمانی كوردی به رز كاته وه وبه تیشكی به تینی كویرایی به چاوی شه مشه مه كویره وكونده بووی شوومی (تاریكی ونه زانین) بهینی . بیگومان نه ته وه یه ك زیندوویه كه زمانه كه ی زیندوو بی وهه روه هاپیناسه ی هه ر گه لیك زمانه كه یه تی له ناو هه موو گه لانی ئه م جیهانه دا . ده با بیین بو بوژاندنه وه ی زمانه كه مان هه رچی له ده ستمان دیت دریغی نه كه ین وگولزاری ویژه و ئه ده بی كوردی به نووسینیكی خاوین ئاودیر كه ین . تاكوو، خونچه نه پشكووتوه كانی ئه م باخچه یه (مندالان ومیرمندالان ولاوان) فیری نووسینی بیهه له ی زمانی شیرینی كوردی بن .





